ئامادەیی کوردستانی نوێی تێکەڵ

# بابەت :ئەدەبی کوردی

ڕاپۆرتێك دەربارەی:

# ( ژیان و هۆنراوەی نالی )

بە سەرپەرشتی : مامۆستای بابەت ( م.توانا حمید )

ئامادەکردنی :


بڕوا حسێن أحمد پۆلی یازدەی زانستی ( أ )


2014-2013



مەلا خدری کوڕی ئەحمەد شاوەیسی ئاڵی بەگی میکایلیی ناسراو بە نالی (1800-1856ز)

# (بسمِ اللّهِ الرحمنِ الرحيم)

## 1. پێشەکی

دیارە نالی یەکێکە لە مەزنترین شاعیرانی کلاسیزمی کوردی و نووسین دەربارەی ژیان و هۆنراوەی ئەو گرنگەیکی زۆری هەیە، چونکە نالی توانیویەتی کە زمانی کوردی بەکاربێێت بۆ بەرز کردنەوە و جوان کردنەوەی شیعرەکەی نەك بەپێچەوانە، و توانیویەتی جوانترین شیعری کوردی بەتایبەتی شیعری دڵداری بنووسێت، لەلای زۆرینەی ئەدیب و نووسەران پێیان وایە کە تا ئێستا شیعری کەسێك نەبووە بگاتە ئاستی شیعرەکانی نالی، پلەی نالی لە ئەدەبیاتی کوردیدا هەروەکو پلەی شاعیری (متنبی) عەرەب بوە، کە ئەویش لەسەردەمی خۆیدا دوو شاعیری دیکەی بالآدەست هەبووە، کە(بحتری و ابوتمام)بوونە، دیارە بۆ نالی هەردوو شاعیر(سالم و کوردی) هەبوونە، لەبەر مەزنی ئەم شاعیرە هەرشەندە بنوسین ناتوانین وەسفی تەواوی شیعری نالی بکەین، چجای ڕاپۆرتێك، هەروەك دیارە ئەم ڕاپۆرتە بەشێوەیەکی سەرەکی کراوەتە ئەم بەشانەوە:

- ژیانی نالی
- ڕووخساری شیعری نالی
- مەبەستە شیعریەکانی
- نالی و دڵبەرەکەی
- ئەوانەی دەربارەی نالی شتێکیان نوسیوە

و ئەو سەرچاوەی کە زۆر پشتم پێ بەستووە دیوانەکەی نالیە و کتێبی بەهاری ڕەوانبێژیە، هیوادارم ئەم ڕاپۆرتە سودێکی هەبێت و بتوانین خزمەتێکی پێ بکەین.

## 2. ژیانی نالی

نالی[1] ناوی خدره بە عەرەبی (خضر) کوڕی ئەحمەد شاوەیسی نالی بەگی میکایلیە[2]، لە ساڵی 1800ز لە گوندی خاك و خۆڵ لە دەشتی شارەزوور لەدایك بووە، هەر لە منداڵیەوە خراوەتە بەر خوێندن لە حوجرە، لەسەرەتا وردە کتێبی فارسی و قورئانی خوێندووە، دواتر زانستەکانی تر قورئان و نەحو و صەرف و فەرموودە و کەلام و بەلاغە و فەلەك و فیقھ و سیرەی خوێندووە، تا ئەمانەی خوێندووە و دواتر ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە، ئەو شوێنانەی کە زۆر تیایدا مابوەوە سنە و سابلاخ و زەردیاوای قەرەداغ و هەڵەبجە و سلێمانین. لە قەرەداغ لای شێخ مووحەممەدی ئیبنولحەیات خوێندوویەتی، لە تەکیەی قەرەداغیش لای شێخ عەلی مەلا ریاضیاتی خوێندووە، لە سلێمانی لە مزگەوتی (سەیید حەسەن) لای مەلا عبداللە ڕەش بووە، زۆرتر لە خانەقای (مەولانا خالید) لە سلێمانی ڕابوادووە. هەروەها زۆریش لە هەڵەبجە و سلێمانی لای شێخ ئەوڵای خەرپانی خوێندووە.

---

[1] هەندێك گومانیان لەوە هەیە کە نازناوی شیعری ڕاستەقینەی نالی ئایە (نالی یان ناڵی یان ناڵێ) بووە، چونکە نالی لە چەند شوێنێك نالی و چەند شوێنێك ناڵی وە چەند شوێنێك ناڵێ بەکار هێناوە وەك:

**وەرە سەیری خیابان و بەیـــــازی دەفتـەری (ناڵی)**

**کە سەف سەف مەسرەعی بەرجەستە ڕیزی سەرووی مەوزوونە**

یان:**تا چاکی نەکەی لەهەوا پڕ لە هەوا سینەیی ناڵی**

**وەک زەنگەڵە ئاوازەیی دەنگی دڵی نایێ**

بەڵام بەزۆری گومان لەوە هەیە کە نالی بێت چونکە لە زۆرترین جار ئەمەی بەکارهێناوە و گونجاوتریشە. و ماناکەی بە تەواوەتی نەزانراوە بەڵام گومان بۆ ئەوە دەڕوات کە مانای قەڵەمی نوسین دێت و بەو ناڵە باریکانەش دەوترێت کە لەناو قەڵەمە کەدایەو کە ئەوسا پێیان نووسیوە.

[2] نالی خۆی ناوناوە لە شیعرەکانیدا ناوی خۆری بە لەتافەت یان تەوریە بەکارهێناوە وەك ئەم نموونەیە:

- **هەرچەندە کە عومری خزر و جامی جەمت بوو**

  **چونکە ئەمەلت زۆرە چ عومرێکی کەمت بوو**

- **خەتی سەبزی لەکەناری لەبی (نالی)هەروەک**

  **(خزر)ی زیندە لەسەر چاھ زولالێکی هەیە**

مووحەممەد ئەمین زەگی بە دەڵێ:(نالی لە ساڵانی 1215-1273ی کۆچی، 1800-1856 زاینیدا ژیاوە، مەعروف خەزنەداریش بەهەمان شێوە، هەروەها کەمال فوئادیش هەمان ساڵ دیاریدەکات، مامۆستا عەلائەدین سەجادی ئەڵێ: 1797ز لە دایکبووە و 1855 مردووە، لەڕاستیدا هیچ کام لەمانە باسی ئەو سەرچاوەیان نەکردووە کەئەم ساڵی لە دایك بوون و مردنەیان لێ وەرگرتووە، کە ئەمەش شتێکی بنەڕەتی و زۆر گرنگە، بەڵام هەندێ شت هەیە دەبنە هۆی ڕوون کردنەوەی سەردەمی نالی و نزیك بوونەوەی لە ساڵی لە دایك بوون و مردنی:

1. نالی پەیوەندیەکی تایبەتی لەگەڵ سلێمان پاشای بابان و ئەحمەد پاشای کوڕیدا هەبووە، هەروەك لەم بەڵگانەی خوارەوە دەردەکەوێت:

**هودهودی دڵ حەبسی بەلقیسی سەبای دیوە یەقین**

**خۆی کە دامێن گیری شاهی ئاصەفی ثانی دەکات**

شاهی ئاصەفی یەکەم حەزرەتی سولەیمان پێغەمبەر بووە، کە وەزیرەکەی ناوی ئاصەفی کوڕی بەرخیا بووە، مەبەستی لە شای دووەمی ئاصەفیش سولەیمان پاشای بابانە.

2. قەصیدە درێژەکەی کەبۆ سالمی هاورێی گیانی بە گیانی ناردووە، کە تێکڕا پرسیارە لە وەزعی سلێمانی پاش نەمانی دەوری بابانەکان.

3. غەزەلەکەی کەبەبۆنەی سەفەری حەجی (نوری ڕودباری) یەوە وتوویەتی کە وەك تێکڕا لە بەیتەکانەوە دەردەکەوێ خاوەنی ڕێبازی نەقشبەندی و یەکێك بووە لە مووریدە ناودارەکانی مەولانا خالید.

بەڵام بەڵگەی تریش بە دەستەوە هەیە پێمان ئەسەلمێنێ کەوا نالی نە 1855 نە تەمەنیشی 56 یان 58 ساڵ بووە جا ئیتر لە 1797 لە دایك بووبێ وەك عەلی موقبیل ئەڵێ یا 1800 ەك ئەوانی تر دەڵێن.

- گەلێ بەیتی نالی هەیە وا ئەگەیەنن کە نالی گەیشتووەتە تەمەنی پیریەکی ڕاستەقینە و بێ هێز بوون کە دیارە ئەوەش لە 58 ساڵی نابێت، وەك دەڵێ:

    1. **موی سپی کردم بە شووشتن ناوی عەینی شۆرە شەط**
    2. **گەرچی موی وەک شیرە، بەو شیرە شکۆفەی کردووە**
    3. **ئەی تازە جوان! پیرم و نوفتادە کەوتووم**
    4. **من پیرم و فانی**

- حاجی مەلا عەبدوولّلّای جەلی زادە(باوکی مەلای گەورەی کۆیە) گێڕاویەتیەوە، کەوا لە ساڵی 1288ك(1871–1872ز) دا نالی لە مەککە دیوە و کە دیویشیە زۆر پیر بووە.

نالی بە چاو خۆی لوتکەی گەشەسەندن و فەرمانڕەوایی بابانی دیوە لە کاتێکدا چووە بۆ حەج لە ڕێی گەڕانەوەدا لەشام هەواڵی ڕووخاندنی میرنشینی بابان و هێرشی عوسمانیەکان و داگیرکردنی سلێمانی دەبیستێت، ئیتر بڕیاری داوە کە نەگەڕێتەوە و ڕوو دەکات ئەستەمبوڵ و هەر لەوێ کۆچی دوایی دەکات.

## 3. ڕووخساری شیعری نالی

وابزانم هەرچەندە لەسەر نالی بنووسرێ ناتوانرێ بگاتە ئاستی هۆنراوەکانی چونکە لەگەڵ هۆنراوەکانی هێڵی کلاسیکەت تاریکی ئەو کات ڕۆشن دەکاتەوە و دەبێتە نیشانەی قوڵی ئەو سەردەمە نالی توانیویەتی جوانترین شیعری کلاسیکی کوردی بنووسێت و بووە پێشەوای شاعیرانی کوردی، ئەو پارچە هۆنراوانەی کە ئێستا لەبەر دەستمان دایە هەموو بەری ڕەنجی کۆکردنەوەی چەند کەسێکی وەك مەلا عبدالکریمی المدرس و کوڕەکانیەتی، چونکە ئەو توانییەتی خزمەتێکی زۆری ئەدەبی کوردی بکات بە کۆکردنەوەی شیعرەکانی نالی لێکدانەوەی، ئەگەر تۆزێ ئەو شیعرانەی نالی کە ئێستا لەبەر دەستمان دایە شەن و کەوی واتە گوزەرانی بکەین لەوانەیە بتوانین تۆزە سەرنجێ هەڵێنجێنین لەو دەریایە بێ بنە فراوانە، نالی وەکو (ابو تمامی) عەرەب زۆر خۆی خەریك دەکا بەوردەکاری و ئەم جۆرە هونەرەوە، لەگەڵ جیاوازیەکا کە نالی تەبعێکی ساف و ڕەوان و ڕۆشنی هەیە و زۆر لەم وردە کاریانەشی بێ خۆ خەریککردنێکی قووڵ بۆی بەدەست دێت کەئەمەش لەبەر چەند هۆیەکی بنەڕەتی بووە:

- ئەو جۆرە هونەرە مۆدەی سەردەم بووە و شاعیر پتر پایەی پێ بەرز بۆتەوە.
- زۆر زانین و ڕۆشنبیری لە زمانی عەرەبی و فارسی.
- خۆدەرخستن و شانازی پتر بە خۆوە.
- شاعیریەتێکی قووڵی زگماك.

نالی لە شیعرەکانی دا کێشی عەروزی بەکارهێناوە کە هەرئەمە لە شیعری کلاسیزمی ڕۆژهەڵاتدا بەکار دەهات، و هەموو پارچە هۆنراوەکە یەك (ڕەویە) یان هەیە واتە هەموو دێڕەکان بە یەك پیت کۆتایان دێت، ئەوەشمان لەبیر نەچێ کە نالی یەکسانی حەرفی پێش دوایی لە هەموو دیوانەکەیدا ڕاگرتووە، وهەروەها هەموو دێڕەکان یەك قافیەیان هەیە، وەکو دەڵێ:

(برق البصر) لەبەر تەلەئلوئی لە نـــالـــــی

(خســـــف القمر) لە ئـــــیشراق قــیامەتی جـــەمالی

نیە دیدەیی چ مەردووم، مەردوومی چ دیــــدە

لە فرووغی خەددی فاریــغ، لە خەیاڵی خاڵی خالی

تا لەکۆتاییدا دەڵێ:

ڕووخی تۆ گوڵێکە سەد وەک هوزاری عاشق، ئەمما

لە هەموو چەمەن دیارە بە نوسوڵی ناڵە (نالی)

هەروەها زۆر جار لەتاکە دێڕێکدا مانایەکی تەواو دەبینین، لە کاتێکدا لە شیعری تازەدا بە هەموو پارچە هۆنراوەکە ماناکە کۆتایی دێت،شتێکی گرنگ هەیە ئەوەیە زمانێکی کوردی تێکەڵ بەوشەی عەرەبی و فارسی و هەندێك جاریش تورکی بەکارهێناوە، ئەمیش لەبەر ئەوە بووە کە زمانی ئەدەبی باو لەو سەردەمەدا زمانی فارسی و عەرەبی و تورکی بوون،چونکە کوردستان یان سەر بەدەوڵەتی عوسمانی یان ئێران بووە بۆیە زمانی وڵات یان فارسی بووە یان تورکی، و زمانی عەرەبی زمانی قورئان بووە و کوردستان یەکێك بووە لە وڵاتە ئیسلامیەکان، سەرەڕای ئەوەی نالی خۆی خوێندەوارێکی ئاینی و کەلایەکی موسوڵمان بووە، بۆیە ئەگەر چی شیعرەکانی بەکوردی نوسیووە و پیتی فارسی بەدەستکاری یان بێ دەستکاری بەکارهێناوە، و موسوڵمانێتیکەشی زۆر کاریگەری تێکردووە، هەر لەسەرەتای دیوانەکەیدا ڕوو لەبارەگای خودا دەکات و دەڵێ:

ئەی جیلوەدەری حوسن و جلوەکـــــێشی تــــــەمـــاشا

ســــــەر ڕشتەیی دیـــن بێ مەددەدی تۆ نیە حاشا

بەو ڕەحمەتە عامە کە دەکــــاســـــەنگی سیپەهـ زەڕ

لــــەم قەلبە کەوەک بەردە، ڕەشە، (ڕش ڕشاشا)

(لاحـــــــــــــولَ ولا طـــــــــــــولَ ولا قـــــــوةَ إلّا

بــــــــــــاللهِ، لـــــهُ القُـــدرةُ، والکــــــائنُ ماشا)

نالی جگە لەوەی وشەی فارسی و عەرەبی بەکارهێناوە تەنانەت هەندێك شیعری هەیە کە تێکڕا بەعەرەبی یان فارسین، وەك:

(دَرُونــــی لِـــــدارِ ال(شارَزُورِ) وَ بَـــــرْدە

کــــــفرمیســـــکِرِ گــــرْمِ إلـــــی آوِ سَرْدە)

(تَـــری وَردَهُ قُـــوتاً وَ جُـــوتاً و ســایـــــقاً

فــــیا قُــوتَـــــیي مِــــــنْ جُــــوتِهِ ثُمَّ فَرْدە)

تَرى عينَة الْأبــــــدانِ مِنْ (خــــاكُ خُـــولِ)ه

(تَــــری مَـــــنْدَلَ الْأورا‌قِ مِنْ ثُــــوزُ گـــــــرْدە)

نالی لەم شیعرە نایابەیدا، کە چ لەبارەی دەوڵەمەندی سۆز و چ لەبارەی تەکنیکی هوونەریەوە، پێشەنگە و بەر لەو چەشنی لە کوردیدا نە بینراوە، کۆمەڵێك وشەی کوردی و عەرەبی بەکارهێناوە و تێکڕا بە شێوەی عەرەبی دایڕشتووەن، پێڕەوی دەستووری زمانی عەرەبی و سەر و بۆر و ژێری دوا پیتی وشەی لە زمانی عەرەبیدا بەسەر بریوون، هونەری نالی لەم پارشە شیعرەدا لەوە دایە کە ئەو وشە کوردیانەی بەکاری هێناون بخرێتە قاڵبی عەرەبیەوە نووسینەوەی ئەم پارچە شیعرە بە دەستووری کوردی ئەو خاسیەتەی لەناو ئەبرد و وچەند وشەیەکی بەکارهێناوە کە بەرهەدوو زمانەکە مانا دەدات. هەروەها چەند هۆنراوەیەکی تری هەیە کە فارسین وەکو:

ابـــروان و طـــبيبان دل افگارانـــــند

هـــــردو پیوسته ازان بر سر بیمارانند

گنج رخسار تو دیدن نبود زهـره مـــرا

کەز زلف تو برو خفته سیه مـارانـــــد

ماهزاران، زغمت خسته و ناکام، ولـی

کامیاب از گل روی تو خس و خارانند

و ئەم هۆنراوانە کە سەرەتاکانیان:

- **تیر ناز نگەهک هر دلە نیـــجە یــــی وار**

**عاشقک پاینە زولفک گیبی یوزبک سری وار**

- **نفس ساعت گیپی ایشلرسە گریاد ایلە طاعتر**

**بر آنـــــک قورمەسی پیرو لنە احیای ساعتـــــــدار**

- **آن زلف مشکبار بدان روی چون نـــگار**

**گرموتە است، کوتهی از وی عجب مدار**

هەروەها هەستاوە بە بەکارهێنانی هەموو ئەو وشەکاریانەی کە لە ڕەوانبێژی دا بەکارهێنراون، لەوانە:

- چواندن(التشبیە): ئەوەیە شتێم بە شتێکی تر بچوێنی کە هاوبەش بن لە سیفەتێك یان زیاتر.

**نـــەو فەوت و وەفاتە سەبەبی عەهــــد و وەفاتــە**

**چوو ساعیقەیی بەردی عەجووز و گوڵ و مول هات**

- دروست(الحقیقة):بەکارهێنانی وشەیە لە مانای بنەڕەتی خۆی.

**گوێ درێژی بار و کورتان بەرز و پاڵانی زێڕیــن**

**چوســــت و وریــاتر لە گــــوێ کورتانی پڵانی و گێژ**

- خوازە(المجاز): ئەوەیە کە وشەیەك بدرێتە پاڵ وشەیەك کە مافی درانە پاڵی نەبێ گەر لەبەر پەیوەندی نێوانیان نەبێت.

**نەی خەڵوەتی موڕانی، بێ دەنگی خود نـــومانــی**

**ڕەنگ زەردی عاشقی بە، نەک زەرد ڕووشەقی بە**

- خواستن(الإستعارة): گواستنەوەی وشە لەمانی بنەڕەتی خۆی بۆ مانایەکی تر پەیوەندی وێکچوون بەیەکیان بەستێتەوە، نیشانەیەکیش هەبێت قەەغەی مانای یەکەم بکات.

**کەژاوە و دار و بار و تەختەیی لوختی لەسەر پوختی**

**دەناڵێنن لە شەوقی طیبە وەک نەستوونی حەنانــە**

- درکە(کنایة):دەربڕینی مانی وشە یان ڕستەیە لەپاڵ مانی بنەڕەت مەبەستت لێی مانای پەیوەست نەبێ.

**مل عەلەم شیرین قەلەم ناهوو شکەم، مەیموون قەدەم**

**سم خڕ و کلک نێستر و منـــــــزل برو عارەق نەڕێـــــژ**

- تەوس(التعریض): ئەو دەربڕینەیە مەبەستت لێی شتێکی تر بێت ڕەوت و باری ڕستە ئاماژەی پێ بکات.

**نێمە مەردین هەموو شێری خەشین پۆشی مەصاف**

**کرمی قەز هەرچی تەنی، بۆ نیسوانــــی تەنــی**

- دژیەك(تباق): کۆکردنەوی دوو وشەی دژ بەیەکە لە واتادا.

**سابوونی کەفی پێتە کەفی زاری چاپلووس**

**خاسیـــەتی (ڕەقی) هەیە نەرمـــی زووبانـــی لووس**

- تەناسووب: واتە کۆکردنەوەی دوو یان چەند شتی هاوجۆر و پێکەوە گونجاو.

**ئەستێرە هەموو مەحـــــوە لە نـــێو نووری قەمەردا**

**یا شەمسـی جەمـــالت شـــەوی گێڕاوە بەفەردا**

- جیناس:ئەوەیە دوو وشە لە خوێندنەوە وەیك یەك بن لەماناداجیاواز بن.

**شەبەهی زولفی شەبـــەهـ گۆنەیە ڕوو گەردانــی**

**بەسـەری ئـــەو کـــەبەسـەودا سەر و سامانم دا**

- ئیقتیباس: وەرگرتنی شتێك لە ئایەتی قورئانی پیرۆز یافەرموودەی پێغەمبەر یا سەرچاوەیەکی ئەدەبی و بەکارهێنانی لە ڕستەدا، نەك بە شێوەی ئەوەی کە تێکستەکە وەرگیراوە وەکو:

**نالی نیەتی سیحری بەیان، حیکمــــــەتی شـــیعرە**

**ئــــــەما نیەتی قووەتـــی دڵ، قـودرەتـی ئینشا**

کە لە حەدیسی (إنَّ مِنَ الشَّعرِ لَحِکمَة وَإنَّ مِنَ البیانِ لَسِحْرا) وەرگیراوە.

یان دەڵێ:**بەم کاسە لەسەر پەنجە دەڵێن نووری عەلا نوور**

**ڕەخشانە لە میشکاتی قەدەحدا وەکوو میسباح**

کە لە ئایەتی:(اللهُ نورُ السَّماواتِ وَالأرضِ مَثَلُ نورِهِ کَمِشکاةٍ فیها مِصباحٌ المِصباحُ في زُجاجَةٍ الزُّجاجَةُ کَأنَّها کَوکَبٌ دُرِّيٌ) تا دەگاتە (نورٌ عَلی نورٍ. . . .)،ئەمە جگە لە گەلێ جۆری جوانی هونەری و وشە ئارایی کەئەگەر یەکێك بەتایبەتی بەدوایاندا بگەڕێ لەوانەیە باسێکی دوور و درێژیان لەسەر بنووسێ.

## 4. مەبەستەکانی شیعری نالی

ئەگەر بەوردی بمانەوێت دەست نیشانی مەبەستەکانی شیعری نالی بکەین ئەوا چەند مەبەستێك لە شیعرەکانی دەبینین:

1. دڵداری: کەبەشی هەرە زۆری شیعرەکانی لەم جۆرەیە، شارەزایانی ئەدەبیاتی کوردی خۆیان بەوە خەریك کردووە کە ئایا ئەو سۆز و هەستەی لە شیعری نال دایە ، سۆزی دڵداری ڕاستەقینەیە یان هەروەك هەموو شاعیرانی کۆن بۆ پیشاندانی توانای شاعیریتیە، ڕاستیەکەی هەرچیەك بێت نالی توانیویەتی جانترین شیعری دڵداری کوردی بنووسێت، وەك دەڵێت:

(1)ئەستێرە هەموو مەحوە لەنێو نـــووری قەمــــەردا
یا شەمسی جەماڵ شەوی گێــــڕاوە بە فـــــەردا

(2)خاکی بەری پێت هەم گڵ و هەم گوڵ بە سورشکم
وەقتی غەم و شادی ئەوە کــردووەمــــە بە ســـەردا

(3)تەلبیسی نیە ئەو کەســـە دێـــوانەیی ڕووتــــە
بێچــــــارە ئەمـــا غەیری حەیاتێکـــــی لەبـــەردا

(5)هەرچەندە کە نینسانە لەبــەر چــاوی من و تــۆ
مومکین نیە ئەم لوطفە لە نینســـــان و بەشـــەردا

(6)ئیثباتی خەت و خاڵە، بەصەد شوشتن و گریـــــان
ناچێتەوە ئەم نوقطە لە نێو دیـــدەیــــــی تـــەردا

(7)نالودە نەبــێ دا، بە زەبوون گیریـــــی خوێنــم
بۆ کوشتنی من دامەنی پاکـــی لە کـــــەمـــەردا

(8)نالی خەبەری بێ ئەثـــەری غانیبـــــــە، ئەمـــــــــا

نـــاڵێکی حەزین دێ لە موناجاتـــــــــــــی سەحـــــــــەردا

2. وەسف: کەئەمیش یەکێکی دیکەیە لە مەبەستەکانی شیعری نالی، بەتایبەتی وەسفی بەهارو دیمەنی سروشتی و وەسفی حوجرە شەق و شڕەکەی ولێهاتوویی بەردەباری(کەر)ەکەی، لەوەسفی بەهاردا دەڵێ:

1. گەرمی و تەڕی بەهارە کەپشکۆ کوژایــــــەوە

پشکۆی گوڵ ناتەشین بە نەسیم بوو، گەشایـــەوە

2. لالە کە مەجمەرێکە بەبا خۆش و گەش دەبێـــت

نـــــاوی، کەپــــــڕ خەڵووزە، بە شەبنم گەشایـــەوە

3. فەسلێکە هەر لە فەرقی بەشەر تا رەگی شەجـــەر

پشکۆی گوڵ ناتەشین بە نەسیم بوو، گەشایـــەوە

لە وەسفی حوجرە شەق و شڕەکەیدا دەڵێت:

ڕۆژی بەفر و با وەکاشە، ڕۆژی باران قوففەیـــــە

ساحیبی لازم کەبیبێ سەوڵ و کاسێکی شکاو

تا دەڵێ:

حوجرەکە ناوس بوو، وەعدەی خۆی بەهارێ بوو بـــزێ

وەزعـــــی حەملی کەوتە پاییز نەبەکام و ناتەواو

لە وەسفی کەرەکەیدا دەڵێ:

ما عەلەم، شیرین قەڵەم، ئاهوو شکەم، مەیموون قەدەم

سم خڕ و کلک نێستر و مەنزڵ بڕ و عارەق نەڕێژ

سانیمەودەهری بە ڕۆژ، ئەمما بـــــەڕۆژووی بـــێ نبیـــــەت

قانیموولڵەیلی سلووک، ئەمما سلوکی بێ نوێژ!

3. نزا و پاڕانەوە لەخوا: کەزۆر بەشێوەیەکی جوان لە شیعرەکەیدا دەردەکەوێت، وەك لەم هۆنراوەیدا دەردەکەوێت:

**وەی کە ڕووژەردی مەدینە و ڕووسیاهی مەککە خۆم**

**دەرکراو و دەربەدەر، یا ڕەب دەخیلی عەفوی تۆم**

**دەفتەری ئەعمالی مـن بێ قەترەیێـکی ڕەحمەتـت**

**کـەی بەسـەد زەمزەم سیاهی نوقتەیێکی لێ دەشۆم؟**

4. بیری وڵات کردنەوە: لە هۆنراوەکەیدا کەبۆ سالمی ناردووە، لەگەڵ غەزەلی (دەرروونی لدارالشارەزوور و بەردە)، لە هۆنراوەکەیدا بەناوبانگەکەیدا بۆ سالم بەڕادەیەك زوخاوی دووری هەڵەڕێژێ لەوانەیە ئەو کەسەش کە ئەمڕۆ ئەیخوێنێتەوە پڕ بەدڵ ماتەمی دایگرێ و لەناخی خەمدا نوقم بێ:

**قوربانی تۆزی ڕێگەتم ئـەی بـادی خـۆش مـروور**

**وەی پەیـکی شارەزا بە هەموو شاری شارەزوور**

**ئەی لوتفەکەت خەفـی و خـواه و هـەم دەمـە**

**وەی سـروەکەت بەشارەتی سەرگۆشەیی حزوور**

تا لە دووایدا دەڵێ:

**زارم وەکـو خـیلال و ئەحیفـم وەکـو خەیـاڵ**

**نایـە دوکـەومە زار و بەدڵدا دەکەم حوتوور**

**لەم شەرحی دەردی غوربەتە لەم سـۆزی هیـجرەتـە**

**دڵ ڕەنـگە بـێ بەنـاو و بـەچاوما بکا عوبوور**

5. لاواندنەوە و پاهەڵدان پاش مردن: غەزەلەکەی بەبۆنەی وەفاتی سلێمان پاشای بابان و لەگەڵ قەسیدەکەی کە وەك ئەڵێن بەبۆنەی مردنی باوکی حەبیبەوە وتوویەتی، کەدەڵێ:

**ماتەم وەکو زوولفەینی سیبیـەهـ گـرتـی سەراپـات**

**پـۆشی لە ڕوخت تەعبییەی بەیـدەق و شامات**

دیدەت وەکو گوڵ سـوورە پڕی شـەونـمی ئەشکـە

یالالەیی پڕ ژاڵەیە دوو نیـرگـسی شـەلات

بۆ گریەیی تـۆ ڕەنگـە منیش هـێنـدە بگـریێم

گـەوهەر بڕێژێنین بە بـوڵندەیی قەد و باڵات

لاکین ئەمە دونیایە گـەهێ سـوور و گەهێ شین

(لایـسأل مـن عـاش و مـن مـات و من فات)

6. مەدح و پیاهەڵدان: مەدحی ڕووباری برادەری کە ئەچێتە حەج، مەدحی سووپای بابان، مەدحی وڵات، مەدحی پێغەمبەر، مەدحی مەککە و مەدینە.کەدێتە مەیدانی نزا و پاڕانەوە لەبارەگای یەزدان بەتەواوەتی ئەچێتە جیهانی گیانیەوە بەرامبەر بەخودا و پێغەمبەر (د.خ) ئەوەپەڕی مل کەچی ئەنوێنێ، سەیریکەن چون وەسفی پێغەمبەر دەکات:

بەقوربانی عـولـومـی ئـەووەلیـن و ئاخرینـت بـم

لـەگـەڵ ئەسراری قورئـانت کەوا ئـەتلافی سوبحانە

مورادم زیـللەت و پـاڕانـەوەی حـاڵە ئـەوەک ئەعتـە

بـەچەند بەیتێکی کوردانە کەوا قورئانت سەنا خوانە

ئەگەر چی کوردی دەوری شارەزووری قەسوەتم، ئەمـا

وەسـیلەم طیبە و حـیلمی شـەفیع و فـەزلی مەننانە

بەسەر هاتوومە سەر ئەو خاکە کە هەر میسقالە زەڕێکی

بـەمیزانی شەفاعەت کێـوی حیلم و بەحری غوفرانە

یان دەڵێ:

ئەی سـاکیـنی ڕایزی مـەدینەی مـنەووەرە

لوتفێ بـکە، بفـەرموو: مـەدیـنەی منە و وەرە

عەرشی بەرین کە دانیرەیـە، ڕەوزە مـەرکـەزە

فەرشی زەمـین بە عەرسەیی تەیـبە مـوجەوهەرە

وەك دەرئەكەویٚ مەدحەكانی نالی سنووریٚكی تایبەتیان هەیە، ڕیا و زووبان لووسی و خۆ بۆ پیٚش بردنەوەیان تیا دەرناكەویٚ.

مەبەستی هەجوو و زەم كردنی خەڵك بەتیٚكڕا تەنها لەسیٚ جیٚگە لەهۆنراوەكانیدادەردەكەویٚت:

یەكیٚكیان لەگەڵ میرزاسەفا شیرازیەتی كە ئەمە سەرەتاكەیەتی:

**قەدری من چەندە لەلای دەوڵەتی دنیایی دەنـــی**

**قەدری ئەو کەکەمتر و هەردوو لە غەمی یەکدی غەنی**

یەكیٚكی تریان دژی وشكە سۆفیە:

**بنواڕە وشکە سۆفی و ڕەقســـی بـە هەلهـەلـە**

**دیسـان لە بـــەحری وشـکە هـەوا کــــەوتە پـیٚ مەلە !**

**ئەم ئەرزە مەزرەعەی عەمەلە و گوڵخانی ئەمـەل**

**هەنـــدی بوو بە مەسجید و هەنـــدی بە مەزبەلە**

**شیٚخم، چ گەرمە حەلقەیی زیکرت بە ڕەشبەڵەک**

**حالـــــی ئەمانە خــــۆ بە جەنـــابت مــــوحەووەلە !**

سیٚیەمیشـان قەسیدە دریٚژەكەیەتی كە بەشیٚوەی پرسـیار و وەڵام كەبە مەسـتوورە خانمی ئەردەڵانیدا وتووە كەئەمەش سەرەتاكەیەتی:

**مەستوورە کە حەســـنا و ئەدیـــبە بە حیســـابیٚ**

**هاتــە خەوم ئەمشەو بە چ نازیٚــــک و عـــیتابیٚ!**

غەزەڵەكەی كە بۆ(سەفای شیرازی) ناردووە،ئەگەر چی بۆنی تووڕەیی و قسە پیٚكردنی لیٚ ئەكریٚ، بەڵام تیٚكڕای قسەكانی باسی ئاینە و لە ئامۆژگارییەوە زیاتر نزیكە،غەزەلەكەشی كە دژی وشكە سۆفیە بەهەجووی زەلامیٚكی تایبەت نادریٚتە قەڵەم، نالی دانوولەی لەگەڵ وشكە سۆفیدا ئەكوڵاوە و ئەم دیاردەی لە تیٚكڕای دیوانەكەی دیارە،

لە هۆنراوەكەی لەمەڕ مەستوورە خانمیشدا مەدح زیاتر بەدی دەكریٚ، ئەوەندە داویٚن پاكی و جوانی داوەتیٚ مەگەر نالی خۆی هەر لەخەودا دیبیٚتی.

## 5.نالی و دڵبەرەکەی

کوردی و مەریوانی لە پێشەکی دیوانەکەی نالیدا باسی (حەبیبە) یان کردوە کە نالی گیرۆدەی خۆشەویستی بووە و کارێکی زۆری کردووەتە بزواندنی هەستی شاعیرانە و خەیاڵی قوڵی، ئەوەشیان وتووە کە خواستوویەتی و بووە بە هاوسەری ژیانی و لەگەڵ ئەوەشدا پەیوەندی خۆشەویستیان وەك یار و دڵدارێك هەر بەردەوام بووە، مامۆستا عەلائەدین سەجادی ئەڵێ:(نالی لە تەکیەی قەرەداغیش دۆستێکی تری هەبووە (ئایشە)ی ناو بووە، ئایشە هەموو جارێ خۆی بەوەوە هەڵەکێشا کە دڵداری نالی بووە، ئەم ئایشەیە تا کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەیەم مابوو، تەنانەت ئەمەم لە شێخ بابە عەلییەوە وەرگرت کە خۆی ئایشەی دیبوو)[3]، بەڵام بە داخەوە لە دیوانەکەیا کەم و زۆر هیچ جۆرە هێمایەك بۆ ئەم ئایشێیە نیە تا ئێستاش چ غەزەل و قەصیدەیەك کە بۆنی ئایشێی لێوە بێ نەبینراوە، بەڵام بوونی تێکڕا دوو ئافرەت یا زیاتر لە ژیانی شاعیرێکدا بە تایبەتی لە هەرێمی لاوێتیدا شتێکی دوور نیە.

نالی لە چەند لایەکی دیوانەکەی دا ناوی (حەبیبە) و لە دوو لاشدا ناوی(مەحبووبە)ی هێناوە)، لەوانەیە مەبەستی لە مەحبوبەش هەر حەبیبە بووە، چونکە بە زاراوەی صەرف حەبیب لەسەر کێشی (فەعیل) پێش ئەوەی بکرێتە (عەلەم) بۆ نێرو مێ بەکاردێت، و حەبیبە بۆ ئافرەت پاش ئەوەیە کە کراوە بە عەلەم، جا هەندێ جار حەبیبە و جاروباریش مەحبوبەی بەکار هێناوە، هەروەها (ناکرێ چ (حەبیبە) چ(مەحبوبە) هیچ کامیان ناوی ڕاستەقینەی یارەکەی نالی بن، چونکە لە کۆمەڵگایەکی وەکو کۆمەڵگای کوردەواری ئاسان نەبوو بۆ مەلایەکی وەك نالی دڵی بە ئافرەتێکەوە بوبێ و ناوی ئەو ئافرەتە بزرێنێ و بیخاتە شیعری خۆیەوە، تەنانەت ئەگەر بە تەمای خواستنیشی بووبێ[4])، شتێکی ئاشکرا هەیە دەربارەی حەبیبە کە چاوی خێل بووە، دیارە ئەمە لە یەکێك لە هۆنراوەکانی نالی دەردەکەوێت کەسەرەتاکەی:

---

3 مێژووی ئەدەبی کوردی:عەلائەدن سەجادی.ل241

4 دیوانی نالی:لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی مەلا عبدالکریم المدرس و فاتح عبدالکریم، بەغدا 1976(چاپی دووەم).ل33.

**پێم دەڵێن (مەحبوبە) خێل و قیچە، مەیلی شەڕ دەکا**

**خێل و قیچە، یا ترازوی نازی نەختێ سەر دەکا**

**خێل و قیچە یا بە غەمزە بۆ نیشانەی دڵ بەچاو**

**مەیلی ڕاست هاوێتنی موژگانی دڵ پەی کەر دەکا**

**چاوی هەم ڕەنگی گوڵی، مەستی شەو و ڕۆژان مەدام**

**یەک لە ئەشگوفتەی بە نەفشە، یەک لە نەیلۆفەر دەکا**

دیارە خێلی لەناو خەڵکیدا بە عەیب دەژمێردرێ، نالی لەم پارچە شیعرەدا بەرپەرچی ئەوانە دەداتەوە کە خێلی حەبیبەیان بە عەیب داناوە، بەشێوەیەك وەسفی ئەو خێلیەی دەکاتەوە کە خێلی لە لای خەڵکی دەکات بەجوانی،چەند نموونەیەك لەو شیعرانەی کە نالی ناوی حەبیبە یان مەحبووبەی بەکارهێناوە:

1. **جەنانی وەک جینان کردم بە ماوا**

**(حەبیبە)ی (ماڵیاوا)،ماڵی ناوا**

2. **خەندە و دەمی (مەحبوبە) کەوا زۆر نمەکینن**

**بەس خۆشە ئەگەر خۆ نمەکی زەخم و برینن**

3. **موژگانی سیەه مەستە وەکو چاوی (حەبیبە)**

**غارەت کە نکەن دێن و دەچن ڕۆح بڕفێنن**

4. **لە دنیا جەننەتی باقی تەلاری شاهیبە ساقی**

**(حەبیبە) طورەیی طەوقی ملی شیرین و عەزرایە**

5. **ناخ لە گەڵ نێمە(حەبیبە) سەری پەیوەندی نیە**

**نەی شەکەر قەددە بەڵێ بەندی هەیە، قەندی نیە**

6. **نالی لەبی (حەبیبە) هەم طیبە، هەم طەبیبە**

**خوڵاصەیی لەبیبە، فەرمانبەری لەبیبە**

**7. دەستم لە گەردەنی خۆت هەڵمەگرە هەی (حەبیبە)**

**وابزانە خوێنی خــۆمــە یــا مـــینــنەتـی ڕەقـــیبە**

ئەوانەی شتێکیان لە بارەی نالیەو نووسیوە وویانە (حەبیبە)ی خواستوە و بووەتە هاوسەری بەلام ناونیشانی (حەبیبە) ی هاوسەری نالی بەتایبەتی لەساڵانی دەرەوەیدا ونە، نە لەنەوەش ئەچێ کە لەگەڵ خۆی بردبێتی بۆ حەج و ئەستەمبوڵ و نە لەنەوەش ئەچێ کەئەو ئەستە گیانی بەگیانیەی لە کوردستاندا بە جێ هێشتبێ، دوور نیە وەك مامۆستا سەجادی لە مێژوەکەیدا ئەڵێت حەبیبە پێش سەرفەری نالی کۆچی دوایی کردووە، و نەبوونی منداڵ و نەوە ئەوەندەی تر مەسەلەکەی تاریك کردووە.

## 6. نامە شیعرییەکەی بۆ سالم

مامۆستا عەلائدین سەجادی دەڵێت:(...لە ساڵی 1830 نالی ئەچێ بۆ حەجوسلێمانی بەجێ دەهێڵێت حەج ئەکات و ئەگەڕێتەوە بۆ شام، چەند ساڵێك لەو ناوەدا ماوەتەوە، لە ساڵی 1834 دا کاغەزە بەناوبانگەکەی کە دەڵێ:

**قوربانی تۆزی ڕێگەتم ئەی بـــــادی خۆش مـــروور!**

**ئــەی پـــەیـــکی شارەزا بەهەموو شاری شارەزوور**

**ئەی لوتفەکەت خەفی و هەوا خـــواه و هـــەم دەمە!**

**وەی ســروەکەت بە شارەتی سەرگۆشەیی حوزوور!**

**ئەی هەم میزاجی ئەشکی تەڕ و گەرمـــی عاشقـــان**

**تۆفانی دیدە و شـــەڕەڕی قەلـــبی وەک تەنـــوور**

**گاهێ دەبی بەڕوح و دەکـــــەی بـــاوەشێنـــی دڵ**

**گاهێ دەبی بە دەم، دەدەمێنی دەمی غورور**

تا دەڵێ: **ئەهلێکی وای هەیە کە هەموو ئەهلی دانشن**

**هەم نازیمی عوقوودن و هەم نازیمی نوموور**

**سەیری بـــکە لە بـــەرد و داری مـــــەحەللەکـــــان**

**دەوری بدە بــــە پرســــــش و تەفتـــیش و خوار و ژوور**

دواتر دەڵێ:(**سەیوان) نەزیری گونبەدی کەیوانە سەبز و ساف**

**یاخۆ بووە بە دانیرەیی ئەنجوومەنی قوبوور**

**نێستەش مەکـــــانی ناسکــــەیە (کانی ناسکـــــان)**

**یـــاخۆ بـــووە بە مـــــەلعەبی گورگ و لوورەلوور؟!**

لە کۆتاییدا دەڵێ:**لەم شەرحی دەردی غوربەتە، لەم سـۆزی هیجرەتە**

**دڵ ڕەنــــگە بــێ بە ئاو بەچاوا بکا عوبوور**

**ئایا مــــەقامی ڕووخسەتە لـــەم بــــەیــــنە بێمــەوە**

**یا مـەسڵەحـــەت تەوەقووفە تایەومی نەفخی سوور؟**

**حاڵی بکە بە خوفیە: کەی ئەی یـــاری سەنــــگ دڵ**

**(نالی) لە شەوقی تۆیە دەنێری سەڵامی دوور...**

ئەنووسێ بۆ سلێمانی...) .

هەندێ شتی زۆر ئاشکرا هەیە:

- ئەو تەئریخەی عەلائەدین سەجاددی دایناوە دەکاتە 1250 کۆچی.
- نالی لە شامەوە نامەکەی بۆ سالم ناردووە، و سالم لە سلێمانی بووە، وەك سالم لە بەیتێکی وەڵامەکەیدا دەڵێ:

**بۆ موڵکی شامە نامەیی مـــن سویـــی (نالی) یە**

**هــەر حەرفـــی ئەو لە وەزعی ویـــلایەت دەدا لەخەبەر**

- لە شیعرەکانی سالمەوە دەردەکەوێ کە وەڵامەکەی لە کاتێکدا داوەتەوە کە دەسەڵاتی بابانەکان بەیەکجاری لە ناوچووە و عوسمانیەکان ڕاستەوخۆ سلێمانیان بەڕێوە بردووە:

**لەو سایەوە کە حاکمی بابـــان بــەدەر کـــران**

**نەیدیوە کەس لە چیهرەیی کەس جەوهەری هونەر**

## 7. لەبارەی نالیەوە نوسیویانە

- پیرەمێرد لە ژێر ناونیشانی (خزمەتێکی بێ هەمتا بە موناسەبەتی تەبعی دیوانی نالیەوە) نوسیویەتی:

(تەقریبەن نەوەد ساڵ لەمەو پێش، ڕۆژێکی ڕەنگ زەردی پاییز کە شینایی ئاسمان غوبارێکی کەسیف داپۆشیبوو، لە دەمە دەمی بەیانیدا پیرێکی سەرو ڕیش سپی نیفتادە، مێزەر بەسەر کە مات و مەلوولی، لەپشت ئەسپێکی بەکورتانەوە ڕوو بە وەیس لە سلێمانی دەرچوو، لە دوایەوە غەیری چەند فەقێیەکی خانەقا نەبێت، تەشییع کەرێکی نەبوو، گاه گاه، بە دەنگێکی حەزینی گریناویەوە، قسەی لەگەڵ ئەم جەماعەتە بچووکە ئەکردوو لە هەموو هەنگاوێکدا جارێ ڕووی بۆلای سلێمانی وەر ئەگێڕا، لەگەڵ هەموو ئاوڕدانەوەیەکدا ئاهێکی گڕاوی تێکەڵاو بە فەزا ئەبوو و فرمێسکێکی مرواری بەسەر ڕیشی سپیدا گلۆر ئەبویەوە.

ئەم پیری فتادەیە مەلا خزر (نالی)بوو!......)[5]

******

- (ئەمین فەیزی)یش نوسیویەتی کە ئەڵێ:

(نالی خەڵکی دێیەك بوو لە شارەزوور کە واقیع بووە لە تەرەفی شەرقی سولەیمانی، ئیسمی (خاك و خۆڵ)ە، مەرحووم تەحسیلی لە قەرەداغ و لە سولەیمانیدا ئیکمال کردووە، قەرەداغ شەش سەعات دوورە لە سولەیمانیەوە، نالی بۆ ئیفای حەج چووەتە حیجاز، لەوێ دەرحەق حەزرەتی فەخری روسول قەسیدەیەکی موکەممەل و موتەوەل نەزم کردووە، چووەتە ئەستەمبوڵ لە ئەسنای سوحبەتا لەگەڵ ئودەبا و فوزەلای ئەوێ، گەلێ ئاسانکاری فیکر و فەتانەتی نواندووە، و زۆر مەزهەری تەوەججوه بووە، تا نیهایەتی عومری لە ئەستەمبوڵ ماوەتەوە، مەدفەنی موبارەکی

---

4 دیوانی نالی:لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی مەلا عبدالکریم المدرس و فاتح عبدالکریم. سنە1379(چاپی هەشتەم).ل726.

ئەوەتا لە (ئۆسکۆدار)ە، زەکای نالی ئینکار ناکرێ، لاکین ئەوەندەی سەنایعی لەفزیە ئیستیعمال کردووە، پیاو ڕەنگە بلێ شیعری ئەو نەتیجەی عیلم و ئیشتیغالە).[6]

- گۆرانیش نوسیویەتی، ئەڵێ:

(مامۆستا پیرەمێرد!

لەکاتێکدا تۆ چاوت بۆ قەڵەم ئەگێرا ئیلهامی خۆتی پێ بنووسی، لە کوردستانی عێراقدا قەڵەم بەدەست سێ چوالا مامۆستای گەورەوە بوون:

قەڵەمێك بەدەست پیری یەکەمی شێوەی سلێمانی، نالییەوە بوو، شیعری کلاسیکی پێ دەنووسی، بە پێچەواندی ئەو هەستی پەسەند و بەرامبەر نالی لە دڵتا بوو، دەست بۆ قەڵەمی ئەو نەبرد، چونکە ئەو وەستایەکی بەهرەدار بوو، بەڵام لەسەر تان و پۆی ئەدەب و عرووزی بێگانە نەخشی ئەچنی، تەنیا چینی خوێندەوای بەرزی دەرەبەگایەتی ئەیانتوانی تێی بگەن، هەرچی تۆ بوویت ئەگەرایت کالایەك دابنێی، بەتەواوەتی خۆماڵی بێت، بەرزی و نزمی گەلی کورد زمان بتوانن لەبەری بکەن).

- هەروەها (عبد الرحمان بەگی سالم) کە ناسراوە بە (سالمی ساحیبقێران) لە پارچەشیعرەکەیدا دەڵێ:

لە ڕۆژی نیمتیحانا دیم بەرابەر ڕونیەتی مەعشووق

کەمەر بەستەی هونەر هاتن بە پیتی عیشقبازانا

لە لایێ نالی و مەشوی[7]، لەلایێ سالم و کوردی

لە هەنگامەی هونەر گەرمی تکاپۆ بوون لەمەولانا

لە مەیدانی بەلاغەتدا سواری مەرکەبی مەزموون

بەکوردی هەریەکە تازی سواری بوون لە بابان!

---

6 هەمان سەرچاوەی پێشوو،ل725.

7 مەبەستیەتی لە مەحوی کە ئەو کات هێشتا نازناوی مەشوی بوو.

- (احمد بەگی فەتاح بەگی ساحیبقڕان) کە ناسراوە بە حەمدی لەم چوار خشتەکیەدا بە شان و بالّی نالی هەلّداوە:

**خەرمانی لەفزی کوردی، (کوردی) کە کردی پێــوان**

**(نالی) کـــە نالّـــی کەسەبێکی دا بەویش لێوان**

**تاراجی کرد کە مەحوی نەفەنــدی بە لوتـــفی خـــۆی**

**عوشریشـــــی دا بە (حەمـــــدی) وتی بیبەرە دیوان**

جگە لەمانەی سەرەوە چەند کەسێکە تر لە جیاتی ئەوەی وەسـفی جوانی و بەنرخی شیعرەکانی نالی بکەن هەستاون بە شێوەیەکی ناشرین باسی شیعرەکانی نالیان کردووە، لەوانە گیوی موکریانی کە دەلّێ نالی هیچی بۆ زمانی کوردی و کوردستان نەکردووە و هەستێکی ڕەقی بەرامبەر بە کورد بووە و ئەو هۆنراوانەی کە گوایا لەبەر هەستی پاکی کوردایەتی نوسـیویەتی تەنها لەبەر نەوس و شوۆرباخۆری خۆبردنەوەپێشەوەوە بووە لەلای میرەکانی بابان.

هەروەها موحەممەد ئەمین کاردۆخی وتارێکی بەناونیشانی (بەدبەختی شاعیر و نوسەرەکانمان) نوسیوە و ئەویش هەمان گلەیی لەنالی کردووە.

عیشقت کە مەجازی بێت خواهش مەکە نیللا کچ
شیرین کچ و لەیلا کچ و سەلما کچ و عەزرا کچ

فەرقی کوڕ و کچ ڕۆشن، وەک فەرقی مەه و میهرە
ئەم فەرقی شەو و ڕۆژە وەک فەرقە لە کوڕ تا کچ

مەه مەه لە مەهی سادە: یەعنی لەقەمەر لادە
هەم شەمس و سورەییا کچ، هەم زوهرەیی زەهرا کچ

بێ بێنە گوڵی ژاڵە هەم بێ بەر و هەم تاڵە
قەدسەر و سنەوبەر کچ، چاو نێرگسی شەهلا کچ

کوڕ وەک گوڵی گوڵزارە ئەمما سەمەری خارە
وەک هەنگی جزووداره، هەنگوینی موصەففا کچ

کوڕ زیبی دەبوستانە، کچ شەمعی شەبوستانە
بۆ بەزمی تەماشا کوڕ، بۆ خەلوەتی تەنها کچ

موو سونبولی ناشوفتە، دووڕدانەیی ناسوفتە
دەم غونچەیی نەشکوفتە تێغکرە کوڕە یا کچ؟

کوڕ تازە و تەڕ مادام سادە وەک خوشکی بێ
ئەمما کە ڕوا سەبزە دیبا کوڕ و زیبا کچ

جەننەت پڕی ویلدانە خادم هەموو غیلمانە
خادیم کەتێیدا حۆرین یەکسەر هەموو حەسنا کچ

گەر ئەشرەف و مەحبووبە یوسف کوڕی یەعقووبە
کچ بوو بە خڕیداری یەعنی کە زولەیخا کچ

سیددیق و عەزیز هەروەک یوسف کەنەبی کوڕ بوو
سیددیقی مەعسوومە وەک داکی مەسیحا کچ

بابێکی هەیە دونیا بۆ عەشقی و مەجازی بەس
(نالی) چیە ئەو بابە نادەم کوڕ و حەوا کچ

# 8. سەرچاوەکان


1. دیوانی نالی: لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی مەلا عبدالکریمی مودەڕڕیس

2. بەهاری ڕەوانبێژی: نوسینی موحسین احمد مصتفی گەردی

3. ئەدەبیاتی کلاسیکی و نوێخوازی کوردی: د.کەمال مەعروف

4. مێژووی ئەدەبی کوردی: عەلائەدین سەجادی

# 9. پێڕست